

# فێڵی شەیتان

## لە دوژمنەکانی الرحمن

## وە دۆستەکانی جهم بن صفوان

لە وەرگرتنی عەقیدەی کوفریان
لە فەلسەفەی ئیغریق و یۆنان



الشاطبي بە نموونە

**عبدالملك الأثري**

**١٤٤٤هـ**

(زنجیرەی چەقڵی چاو و دڕکی قوڕگی بەرگیریکاران لە ئەشعەرییە جەهمییەکان : ٢)

# قال الله عز وجل :

| يَسْمَعُونَ كَلَامَ اللَّهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُ مِن بَعْدِ مَا عَقَلُوهُ وَهُمْ يَعْلَمُونَ | (البقرة : ٧٥)

الله تعالی باسی بەشێک یەهودیەکان ئەکات کە تەوراتیان خوێندەوە، پاش ئەوەی لێی تێگەیشتن و بەدڵیان نەبوو مانا و واتای کەلامی الله تعالی ـیان گۆڕی .

ئەشعەریە جەهمیەکانیش لەجیاتی ئەوەی عەقیدەی خۆیان لەسەر قورئان فەرموودە بنیاد بنێن ڕۆشتن عەقیدەی خۆیان لەسەر بەناو عیلمی کەلامی کوفری دامەزراند، پاشان هاتن قورئان و فەرموودەیان خوێندەوە و تێیگەیشتن کە بەپێی عەقیدە کەلامیە کوفریەکەیان بێت قورئان و فەرموودە تەشبیهـ و کوفر و تەجسیمە، هەربۆیە مانای ئایەت و فەرموودەکەیان گۆڕی بۆ ئەوەی بگونجێت لەگەڵ بەناو عیلمی کەلامی کوفریدا، بەوهۆیەشەوە چوونە ئاستێک کە تەنانەت منداڵێک شارەزاترە لەوان بە تەوحید و سوننەت .

# الشاطبي الأشعري الجهمي و موافەقەکردنی جەهمی و موعتەزیلەکان

**١** - الشاطبي الأشعري الجهمي هەمان ڕێچکەی موعتەزیلی و جەهمیەکانی گرتووەتەبەر لە کتێبی **(الإعتصام : ٧٢٣/٢)** بۆ سەلماندنی بوونی دروستکار، وە بۆ سەلماندنی مەخلوقێتی جیهان بە ڕێچکەیەکی کەلامی جەهمی کە پێی ئەوترێت الأعراض .

لێرەدا باسی ئەوە ناکەین کە بابەتی الأعراض چییە و چۆنە، چونکە بابەتێکی کەلامی کوفریە، وە هۆکاری سەرەکی کوفری ئەشعەری و جەهمیە و موعتەزیلیەکان هەر ئەم بابەتەیە .

لێرەدا لەوانەیە پرسیارێک بێتە پێشەوە : باشە بۆچی جەهمی و موعتەزیلی و ئەشعەریەکان بەڵگەی کەلامی کوفری ئەهێننەوە بۆ سەلماندنی مەخلوقێتی جیهان؟ چ پێویست ئەکات؟ ئەوە نییە خۆمان ئەبینین کە جیهان (دنیا) دروست کراوە و ڕۆژانە و وەرزانە چەندین مردن و زیندوو بوونەوەی وەرزەکان شتەکان ئەبینین لە دنیا و ... هتد .

بەڵێ وایە، پێویستت بە هیچ بەڵگەیەک نییە چونکە هەمووومان هەست بەم شتە ئەکەین وەکو ڕۆژی ڕووناک، بەڵام ئەشعەریە جەهمیەکان ویستیان وەڵامی فەیلەسوفەکان بدەنەوە لەم بابەتەدا، وەکو ئیبن سینای فەیلەسوف، جا بەهۆی ئەمەوە خۆیان تووشی کوفرێکی گەورەتر کرد لەوەی کە ڕایان ئەکرد لێی .

پوختەی بابەتەکە ئەوەیە : فەیلەسووفەکان باوەڕیان بە ئەزەلیەتی عالەم (دنیا یان جیهان) هەیە، واتە پێیان وایە الله عز وجل ئەم جیهانەی دروست نەکردووە، بەڵکو هەر هەبووە، وە ئیبن سینا ش یەکێکە لەو فەیلەسوفە کافرانە، جا لە بەرامبەردا موعتەزیلی و جەهمی و ئەشعەریەکان هاتن بە الكلام دژی فەیلەسوفەکان وەستانەوە، وە هەندێ پێشەکی کوفریان دانا وەکو بابەتی الأعراض تا بیسەلمێنن کە جیهان دروستکراوە، پاشان هەر بە هەمان پێشەکی هاتن تەواوی سیفەتەکانی الله تعالى یان پەکخست و خۆیان تووشی کوفر کرد، بەهۆی ئەوەوە هەموو ئایەت و فەرموودەکانی سیفاتیان تەحریف کرد، ئەمەش بەڵای بەناو عیلمی الكلام ـە کە تووشی بەکارهێنەرانی کرد .

وە هەر ئەم ڕێچکەیەیە وای لە جهم بن صفوان کرد بڵێت کە بەهەشت و جەهەننەم لەناو ئەچن، وە وای لە أبو هذيل العلافي ئیمامی موعتەزیلەکان

کرد بڵێت ئەهلی بەهەشتیەکان و جەهەننەمیەکان لە کۆتایدا جووڵەیان نامێنێت، وە وای لە کوللابی و ئەشعەریەکان کرد نەفی سیفاتەکانی اللە تعالی وە بە تایبەتی سیفاتە فیعلیەکان وەکو (الکلام، النزول، المجئ ...)ی اللە تعالی بکەن .

## الشاطبي الأشعري الجهمي و

## تفويض ــی مانای سیفاتەکانی الله عز وجل

عەقیدەی الشاطبي لە بابەتی ئەسماء و سیفات هەمان عەقیدەی ئەشعەریە جەهمیەکانە، لە هەندێ شوێندا تفويض ئەکات، واتە ئەڵێت کە واتا و چۆنیەتی فڵانە سیفەتی الله تعالى زانراو نییە، یاخود دێت تەحریفات (تەئویل) ئەکات بۆ ئایەت و فەرموودەکان، وە بە حسابی خۆی عەقیدەی تفويض ی سیفەتەکان عەقیدەی سەلەفە .

وە بزانە ئەو دوو ڕێچکەیەی الشاطبي گرتویەتیەبەر (تفويض ی واتا و تەحریف کردن) هەردووکیان سەرئەکێشێت بۆ پەکخستن و جەهمیەت، چونکە تۆ کە وتت واتای سیفاتەکە دیار نییە ئەوە سیفەتەکەت بۆ الله جێگیر نەکردووە، وە کە تەحریفت کرد بە هەمان شێوە سیفەتەکەت بۆ الله عز وجل جێگیر نەکردووە .

بزانە رحمک اللە عەقیدەی سەلەف بریتیە لە جێگیرکردنی هەموو ئەو سیفەتانەی لە قورئان و فەرموودە و ئیجماعی سەلەف هاتووە، بەشێوەک کە واتای سیفەتەکە ئەزانن، وە چۆنیەتی سیفەتەکە نازانن .

بۆ نمونە اللە تعالی دەستی هەیە لەبەر ئەوەی لە قورئان و فەرموودەدا فەرموویەتی دەستی هەیە، واتە واتای دەست ڕوونە، بەڵام چۆنیەتی دەستەکە نادیارە، واتا نازانین دەستی اللە تعالی چۆنە، بەم شێوەیە سەلەف تفویض ی چۆنیەتی سیفەتەکە ئەکەن، بەڵام تفویض ی واتای سیفەتەکە ناکەن بەڵکو لەسەر ڕووکەش وەری ئەگرن و ئیمانیان بە ڕووکەشەیەکەتی .

بزانە زۆر مەترسیدارە ئەگەر واتای سیفەتەکانی اللە تعالی تفویض بکەیت، چونکە تۆ دان دەنێیت بەوەی کاتێک رسول اللە ﷺ باسی سیفەتەکانی اللە تعالی ی کردووە بۆ هاوەڵان، نە خۆی تێگەیشتووە مەبەستی چییە و چی ئەڵێت، وە نە هاوەڵانیش لە قسەکانی تێگەیشتوون، واتە تۆ رسول اللە ﷺ و هاوەڵان بە جاهیل دائەنێیت لە بابەتی ئەسماء و سیفات، وە ئەسماء و سیفات بەشێکە لە سێ بەشەکەی تەوحید، بەم شێوەیە دانت ناوە بەوەی کە رسول اللە ﷺ و هاوەڵان لە بەشێکی تەوحید جاهیل و نەزان بوون، هەندێک شتیان وتووە خۆشیان نەیانزانیوە یاعنی چی!

وە بزانە هەرکاتێک ئەشعەریە جەهمیەکان باسی مەنهەجی سەلەف ئەکەن لەبارەی ئەسماء و سیفات ئەوە مەبەستیان تفویض ە، ئەگینا مەنهەجی ڕاستەقینەی سەلەف کە بریتیە لە جێگیرکردنی ڕووکەشی ئایەت و فەرموودەکان ئەشعەریە جەهمیەکان بە کوفر و تەشبیهـ و تەجسیم و زەندەقەی ئەزانن .

ئەوانەی کە تفویض ئەکەن پێیان وایە ڕووکەشی ئایەتەکە کوفر و تەشبیهە، هەر بۆیە خۆیان ئەدزنەوە لە جێگیرکردنی سیفەتەکە بە بیانوی ئەوەی ئایەت و فەرموودەکانی سیفات لە موتەشابیهەکانن نەک لە موحکەمەکان، هەر بۆیە بە حسابی خۆیان ماناکەی نازانن و تفویض ی ئەکەن!

**٢** - الشاطبي الأشعري الجهمي لە **(الإعتصام : ١ / ٣٠٤ - ٣٠٥)** دەربارەی ئایەتەکانی سیفات ئەڵێت کە (لە موتەشابیهەکانی قورئانە، وە موتەشابیهیش نازانین واتای چییە، مادەم وایە تفویض ی ئەکەین، وە ئەڵێن کە مانای ئایەتەکە نابێت دژی **ئەسڵێکی قطعي** بێت، جا ئەگەر ماناکەی دژی **ئەسڵێکی قطعي** بوو وەکو تەشبیهـ ئەوە بەڵگە نییە) .

لە ڕاستیدا ئەمە هەمان عەقیدەی جەهمیەکانە، وە ئایەتەکانی سیفات لە ئایەتە موحکەمەکانن نەک موتەشابیهەکان، وە دوو شت ئەڵێت کە

عەقیدە جەهمیەتەکەی دەرئەخات، یەکەمیان کاتێک ئەڵێت نابێت دژی **ئەسڵێکی قطعي** بێت، ئەسڵی قطعي لای کەلامیە زەندیقەکان ئەو یاسایانەیە کە بە مێشکی پووچی خۆیان لەسەر بناغەی فەلسەفەی یۆنان دایانناوە قورئان و سوننەتی لە قاڵب ئەدەن و پێی ئەڵێن ئەسڵی قطعي، واتە یاسایە و لە سەدا سەد ڕاستە و ئەبێت قورئان و فەرموودە دژی ئەم ئەسڵە قطعي یانە نەبن .

وە کە ئەڵێت مانای ئایەتەکە نابێت تەشبیه بێت ئەگینا دژی ئەسڵی قطعي یە، مەبەستی لە مانای ڕووکەشی ئایاتەکەیە، پێی وایە کە مانای ڕووکەشی ئایەتەکە تەشبیهە، هەر بۆیە دواتر ئەڵێت لە موتەشابیهەکان و ماناکەی دیار نییە، بەم شێوازە خۆی ئەدزێتەوە لە جێگیرکردنی سیفەتەکان .

٣ - الشاطبي الأشعري الجهمي لە **(الإعتصام : ٢ / ٥٨٦)** ئەڵێت کە (زانایان نەهیان کردووە لە قسەکردن لە موتەشابیهات لە سیفات و ئەفعالەکان)، لێرەدا الشاطبي سیفاتەکانە الله عز وجل بە موتەشابیه ناو ئەبات .

٤ - الشاطبي الأشعري الجهمي لە **(الإعتصام : ٢ / ٧٣٦)** ئەڵێت (موتەشابیه ئەوەیە کە وەکو تەشبیه دەربکەوێت) تەماشا بکە الشاطبي پێی

وایە مانای ئایەت و فەرموودەکانی سیفات تەشبیهە، هەر بۆیە ئەڵێت موتەشابیهن و تەفویضیان ئەکات .

**٥** - الشاطبي الأشعري الجهمي لە **(الإعتصام : ٢ / ٨٤٠)** کاتێک باسی بەڵگە موتەشابیهەکان ئەکات نمونە بە سیفاتەکانی الله عز وجل ئەهێنێتەوە
.

**٦** - الشاطبي الأشعري الجهمي لە **(الموافقات : ٤ / ١٣٧)** زۆر بە جوانی عەقیدەی خۆی ڕوون ئەکاتەوە و ئەڵێت کە ئەو بەڵگەیانەی کە ماناکانیان دیار نییە و ئێمەش تەکلیفمان لێ نەکراوە ماناکانی بزانین وەکو | ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ | (طه : ٥) یان (پەروەردگارمان دائەبەزێتە ئاسمانی دنیا) .

تەماشا بکە رحمک الله مانای ئەو ئایەت و فەرموودەیە زۆر ڕوون و ئاشکران .

پرسیار لە یزید بن هارون ئەکەن جەهمیەکان کێن؟

ئەڵێت : هەر کەسێک پێی وابێت | ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ | بە پێچەوانەی ئەوەیە کە لە دڵی خەڵکی عەوام جێگیر بووە ئەوا ئەو کەسە جەهمیە.

**السنة لعبدالله بن الإمام أحمد**

لەلای سەلەف تەنانەت خەڵکە عەوامە ئاساییەکەش ئەزانن مانای ئەو ئایەتە چییە، وە بگرە هەر کەسێک بەو شێوەیە لە مانای ئایەتەکە تێنەگات کە خەڵکی ئاسایی لێی تێئەگات ئەوە جەهمیە ! بەڵام الشاطبي الأشعري الجهمي ئەڵێت مانای ئایەتەکە دیار نییە! هەر بۆیە تفویضی ئەکات، بەڵام دڵنیابە زۆر بەباشی ئەزانێت مانای ئایەتەکە چییە، بەهۆی عەقیدە کەلامە کوفریەکەیەوە پێی وایە واتای ئایەتەکە تەشبیهە، هەربۆیە ئەڵێت ماناکەی دیار نییە !

**٧** - الشاطبي الأشعري الجهمي لە **(الموافقات : ٣ / ٣١٩ - ٣١٨)** ئەڵێت کە (سەلەف ڕۆنەچوون لە مانای سیفەتەکانی الإستواء و النزول و الضحک و الید و القدم و الوجه و شێوەی ئەوانە) .

سەلەف هەموویان رحمهم الله زۆر بە جوانی لە مانای ئایەت و فەرموودەکانی سیفات تێگەیشتوون، بەڵام بەدوای چۆنیەتی سیفەتەکەدا نەگەڕاون، بەڵام لەلای الشاطبي سەلەف ئەسڵەن نەیانزانیوە مانای ئایەتەکانیش چییە!

هەر بۆیە لەلای الشاطبي رسول الله ﷺ و هاوەڵان و تابیعین و ئیمام و پێشەواکانی سەلەف هیچیان نەیانزانیوە واتای ئایەت و فەرموودەکانی سیفات چییە لەکاتێکدا یزید بن هارون ئەڵێت هەر کەسێک پێی وابێت |

ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ | بە پێچەوانەی ئەوەیە کە لە دڵی خەڵکی عەوام جێگیر بووە ئەوا ئەو کەسە جەهمیە.

جا الشاطبي پێی وایە واتای ئایەتەکە کوفر و جەهمیەتە، هەر بۆیە تفویض ی ئەکات .

# الشاطبي الأشعري الجهمي و ناوبردنی جێگیرکردنی ئایەتەکانی سیفات لەسەر ڕووکەش بە تەشبیهـ

چەندینجار وتوومانە کە ئەشعەریە جەهمیەکان ئایەت و فەرموودەکانی سیفات بە کوفر و تەشبیهـ و تەجسیم ئەزانن .

٨ - الشاطبي الأشعري الجهمي لە **(الموافقات : ٢٢٣/٤)** ئەڵێت (وەک چۆن ئەهلی تەشبیهـ وا گومانیان برد کاتێک دەستیان گرت بە ڕووکەشی ئایەتی | تَجْرِي بِأَعْيُنِنَا | ، | مِمَّا عَمِلَتْ أَيْدِينَا | ، | وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ | ، | وَالْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ | ) .

الشاطبي ئەوانە بە موشەبیهە ناو ئەبات کە سیفەتەکانی الله تعالى یان بە ڕووکەشی ئەم ئایەتانە جێگیرکردووە، وە بێئاگا نییە کە ئیمامی بوخاری رحمه الله لە سەحیحەکەی بابێکی تایبەتی داناوە بۆ جێگیرکردنی سیفەتی چاو بۆ الله تعالى بە ئایەتی | تَجْرِي بِأَعْيُنِنَا | .

وە پێی وایە وەرگرتنی ئەم ئایەتە لەسەر ڕووکەش کوفرە | وَالْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ | لەکاتێکدا لە سەحیحی بوخاری فەرموودەی **٧٤١٤** لە باسی إبن حجر (https://t.me/imamakany_kufr/208) بە تەواوی هەموویمان داناوە رسول الله ﷺ باسی سیفەتی پەنجە ئەکات بۆ الله تعالی و دواتر ئەو ئایەتە ئەخوێنێتەوە کە الشاطبي بە بە تەشبیهی ئەزانێت .

**٩** - الشاطبي الأشعري الجهمي لە **(الموافقات : ١٠/٤)** ئەڵێت کە هەر شتێک کە ڕووکەشەکەی تەشبیهـ بێت ئەوە ڕووکەشەکەی مەبەست نییە .

پێشتریش ڕوونمان کردووتەوە کە مەبەستی لە تەشبیهـ وەرگرتنی ئایەتەکانی سیفاتە لە قورئان و سوننەتدا لەسەر ڕووکەش .

**١٠** - وە هەر لە **(الموافقات : ٢١٦/٥)** باسی تەئویلکردنی ئەو ڕووکەشانەی ئەکات کە (بە حسابی خۆی) تەشبیهـە .

سەلەف رحمهم الله تعالی لەسەر ئەوە کۆکن کە ئایەت و فەرموودەکانی سیفات لە قورئان و فەرموودەدا لەسەر ڕووکەش وەرئەگیرێت، وە کاتێک هەر سیفەتێکیان بۆ الله تعالی جێگیرکردووە باوەڕیان وابووە کە سیفەتەکەی الله بە هیچ شێوەیەک لە سیفەتی مەخلوقاتەکانی ناچێت، وە هەر کەسێک پێی وابێت سیفەتەکانی الله لە سیفەتەکانی مەخلوقاتەکانی

ئەچێت ئەوە موشەبیهە و کافرە، وە هەر کەسێک وەکو الشاطبي پێی وابێت وەرگرتنی ئایەت و فەرموودەکانی سیفات لەسەر ڕووکەش تەشبیهە ئەوە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵان و سەلەفی بە موشەبیهە داناوە، بەڵام الشاطبي خۆی ئەشعەریەکی پەکخەری جەهمی زەندیقە .

# الشاطبي الأشعري الجهمي و نەفیکردنی سیفەتەکانی الله تعالی

**١١** - الشاطبي الأشعري الجهمي لە **(الموافقات : ١٥٤/٤)** لەبارەی ئەم ئایەتانەی کە موسوڵمانان سیفەتی العلو ی پێ جێگیر ئەکەن | يَخَافُونَ رَبَّهُم مِّن فَوْقِهِمْ : لە پەروەردگاریان ئەترسن کە لە سەرەوەیانەوەیە | (النَّحل : ٥٠)، وە | أَأَمِنتُم مَّن فِي السَّمَاءِ : ئایا ئەمین بوون لەوەی کە لە ئاسمانە؟ | (المُلكِ : ١٧) ئەڵێت : (بێگومان ئەمە هیچ بەڵگەیەکی تێدا نییە لەسەر جێگیرکردنی شوێن) .

ئەشعەریە جەهمیەکان مەبەستیان لە نەفیکردنی شوێن بۆ الله تعالی نەفیکردنی علو وە، وەک چۆن جەهمیەکان بە وتنی الله لە هەموو شوێنێکە نەفی ئەوە ئەکەن الله تعالی لەسەر عەرش بێت، ئەشعەریە جەهمیەکانیش بە وتنی الله لە هیچ شوێنێک نییە نەفی علو ئەکەن، چونکە هەردووکیان نەفی ئەوە ئەکەن الله تعالی بە ذاتی خۆی لەسەر عەرش بێت .

**١٢** - الشاطبي الأشعري الجهمي لە **(الإعتصام : ٧٨٧/٢)** ئەڵێت : (بیدعەی ظاهیریەکان* لەلایەن کۆمەڵێکەوە هێندە گرنگی پێ درا هەتا باسیان کرد لەبارەی ئایەتی | ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ | (طه : ٥) : دانیشتووە، جا بەمە ناوبانگیان دەرکرد و شەڕیان لەسەر کرد) .

الشاطبي بەو کەسانەی کە ڕووکەشی ئایەت و فەرموودە وەرئەگرن (موسوڵمانان) ئەڵێت ظاهیری، وە پێی وایە وەرگرتنی ئایەت و فەرموودەکان لەسەر ڕووکەش بیدعەیە! نەخێر بەڵکو عەقیدەی رسول الله ﷺ و هاوەڵان و تەواوی سەلەفە .

موسوڵمانان سیفەتی الجلوس بۆ الله تعالى جێگیر ئەکەن بە پشتبەستن بە نۆ فەرموودە کە لە رسول الله ـەوە ﷺ ڕیوایەت کراوە، وە نزیکەی پانزە ئەثەر کە لە زانایانی سەلەفەوە نقڵ کراوە .

وە لە الحسن البصري و عكرمة و عبدالوهاب الوراق ـەوە هاتووە کە هەمان ئەو تەفسیرەیان کردووە بۆ ئایەتی پێنجی سوورەتی طه کە الشاطبي پێی ئەڵێت بیدعەی ظاهیریەکان .

**١٣** - الشاطبي الأشعري الجهمي نەفی سیفەتی کەلامی الله تعالى ئەکات بەوەی کە ئەڵێت کەلامی الله بە حرف و صوت نییە، وە شوێن إبن كلاب

کەوتووە لە تەحریفکردنی سیفەتی کەلامی اللە تعالی بە کەلامی نەفسی، وەک چۆن لە **(الإعتصام : ٣٠٧/١)** ئەڵێت : (بەڵام ئەوەی کە کەلام صوت و حرف ە لەبەر تەماشانەکردنی کەلامی نەفسی وتراوە کە لە ئەسڵەکاندا باس ئەکرێت) .

لێرەدا کەلامی نەفسی کە بیدعەی إبن کلاب ی جەهمیە و ئیمام أحمد لەسەر ئەوە تەکفیری کرد لەلای الشاطبي لە بنچینەکانی عەقیدەیە .

وە مانای قسەکەی ئەوەیە خەڵکی تەماشای بابەتی کەلامی نەفسی ناکەن بۆیە ئەڵێن کەلامی اللە عز وجل حرف و صوت ە، وە بێگومان وایە موسوڵمان هەرگیز ئاوڕ لە بیدعەی کوفری جەهمی و کوللابیەکان ناداتەوە هەتا سیفاتەکانی اللە تعالی بدات لە قاڵبی بیدعە کوفریەکانیان .

ئەوەی الشاطبي پێی ئەڵێت بنچینە ئیمام أحمد جەهمیەکانی لەسەر تەکفیرکردووە

- عبداللە ی کوڕی ئیمام ئەحمەد ئەڵێت : پرسیارم لە باوکم کرد دەربارەی کۆمەڵەیەک کە ئەڵێن : کاتێک اللە قسەی لەگەڵ موسی علیە سلام کرد بە دەنگ قسەی لەگەڵ نەکرد؟

باوکم وتی - واتە ئیمام ئەحمەد - : بەڕاستی پەروەردگاری تۆ بە دەنگ قسەی کرد، ئەم فەرموودەیانە بەڕێ ئەکەین وەکو چۆن هاتووە.

وە وتی : فەرموودەی ابن مسعود رضي الله عنه : کاتێک الله قسە ئەکات دەنگێک دێت وەکو تێپەڕوونی زنجیرێک بەسەر بەردێکی ساف دا. باوکم وتی : ئەمە جەهمی ڕەتی ئەکاتەوە.

باوکم وتی : ئائەوانە کافرن، ئەیانەوێت سەر لە خەڵکی تێکبدەن، هەرکەسێک وا گومان ببات کە الله قسەی نەکردووە ئەوە کافرە، ئێمە ئەم فەرموودەیانە ئەگێڕینەوە وەک چۆن هاتووە.

**السنة لـ عبدالله بن أحمد والسنة لـ الخلال**

المروذي رحمه الله وتی : گوێم لە باوکی عبدالله - ئیمام ئەحمەد - بوو پێی وترا : عبدالوهاب وتوویەتی : ئەوەی وا گومان ببات الله بەبێ دەنگ (بلا صوت) قسەی لەگەڵ موسی دا کردووە ئەوە جەهمیە، دوژمنی الله ە، دوژمنی ئیسلامە.

باوکی عبدالله زەردەخەنەی کرد و وتی : چەندە باشی وتووە، الله لێی خۆش بێت .

**لسنة لـ الخلال**

**١٤** - وە هەر الشاطبي لە الإعتصام **(٢ / ٨٤٣ - ٨٤٤)** ئەڵێت کە (**مەحاڵە** کەلامی الله بە حرف و صوت بێت) .

تەماشا بکە رحمک الله ئەشعەریە جەهمیەکان دەربارەی سیفەتەکانی الله تعالى ئەڵێن کە **مەحاڵە** الله خاوەنی فڵانە سیفەت بێت .

بۆچی ئەڵێن مەحاڵە؟ لەبەر ئەوەی ئەو زەندیقانە بناغەی عەقیدەی خۆیان لەسەر بەناو عیلمی کەلام داناوە، وە چەندین یاسایان بۆ سیفاتەکانی الله تعالى داناوە، وە یاسا کوفریەکانیان پێچەوانەی ئەو سیفەتانەیە کە لە قورئان و فەرموودەدا هاتووە، بگرە ڕووکەشی ئایەت و فەرموودەکان بە کوفر و تەشبیه ئەزانن، هەر بۆیە ئەڵێن مەحاڵە .

# الشاطبي الأشعري الجهمي پەکخستنی بینینی الله تعالى لە قیامەتدا

**١٥** - الشاطبي الأشعري الجهمي لە **(الإعتصام : ٨٤٣/٢)** نەفی بینینی الله تعالى ئەکات قیامەتدا، ئەشعەریە جەهمیەکان لە ڕووکەشدا هەمان قسەی ئەهلی سوننە ئەکەن، ئەڵێن کە (الله لە ئاخیرەتدا ئەبینرێت)، بەڵام دواتر دێن تەفسیری قسەکەیان ئەکەن بە هەمان قسەی جەهمی و موعتەزیلەکان، ئەڵێن ئەبینرێت بەڵام لە شوێنێک نا، ئەمە ئیشی هەمیشەییانە لەگەڵ سیفەتەکانی الله عز وجل، ئەڵێن الله ئەبینرێت بەڵام بەبێ مقابلة و بەبێ جهة و بەبێ اتصال أشعة و فضل جسم شفاف و بەبێ ... لەگەڵ دەیان (بەبێ) ی تر کە لەسەر عەقیدە کەلامیەکەیان دایانڕشتووە و عەقیدە کوفریەکەیان دەرئەخات، بۆیە ئەهلی سوننە هەر لە زووەوە پێیان وتوون زەندیق، چونکە لە ڕووکەشدا خۆیان وا پیشان ئەدەن کە موافقی موسوڵمانانن، بەڵام لەژێرەوە یان لەدوای هەندێک ڕوونکردنەوە هەمان عەقیدەی جەهمی و موعتەزیلیلە کافرەکانیان هەیە، هەر بۆیە خیلافی نێوان ئەشعەریە جەهمیەکان و موعتەزیلە کافرەکان لە بینینی الله تعالى لە

قیامەتدا تەنها خیلافێکی لەفظیە، واتە تەنها لە ڕووکەشدا قسەکانیان لەیەک جیاوازە ئەگینا ئەسڵدا هەمان عەقیدەیان هەیە .

موجەدیدی سەدەی شەشەم لای ئەشعەریە جەهمیەکان فخر الکفر الرازي لە **(محصّل أفكار المتقدمين و المتأخرين من العلماء و الحكماء و المتكلمين : ١٨٦)** ئەڵێت ئەو شتەی دایانهێناوە (واتە بینینی الله تعالى بەبێ مقابلة و بەبێ جهة و بەبێ اتصال أشعة و فضل جسم شفاف و بەبێ . . . . لەگەڵ دەیان (بەبێ) ی تر) شتێکە پێشتر هیچ کەسێک ئەم قسەیەی نەکردووە نە لە موسوڵمانە سونیەکان نە لە بیدعەچیەکان و کافرەکان .

وە هەر لەو کتێبەدا لە لاپەڕە **١٨٩** دا ئەڵێت کە (موشەبیهەکان ڕێگەیان داوە بە بینینی الله لەبەر ئەوەی پێیان وایە الله شوێنی هەیە) .

موعتەزیلەکان بەبێ پێچ و پەنا بینینی الله تعالى لە قیامەتدا ڕەت ئەکەنەوە بەهۆی هەندێ قاعیدەی کەلامی کوفری، وە ئەشعەریە جەهمیەکان ئەوکاتە ئەم بیدعە کوفریەیان داهێنا کە لەلایەن موعتەزیلە کافرەکانەوە مولزەم کران بەوەی کە (مادەم نەفی علو و شوێن بۆ الله تعالى ئەکەن کەوایە ئەبێت نەفی بینینی الله تعالى ش بکەن) وەک چۆن القاضي عبدالجبار المعتزلي لە **(شرح أصول الخمسة : ٢٤٨)** بەوە مولزەمی کردوون، ئەمەش ئیلزامێکە کە ئەشعەریە جەهمیەکان بە هیچ شتێک لێی دەرناچن

تەنها بە داهێنانی کوفرێکی دیکە نەبێت، هەربۆیە لەکۆتاییدا ئەو بیدعە کوفریە دائەهێنن کە لە سەرەوە باسمان کردووە .

هەر لەبەر ئەو ئیلزامەی موعتەزیلیەکانە کە الشهرستاني لە **(نهاية الأقدام في علم الكلام : ٣٥٦)** بینینی اللّه عز وجل تەئویل ئەکات بە العلم .

إبن تيمية دان بەوەدا ئەنێت کە مەزهەبی ئەشعەریە جەهمیەکان و موعتەزیلەکان لە بابەتی الرؤية دا هەمان شتە لە **درء التعارض بن العقل والنقل (٢٥٠/١)** ئەڵێت : (وەکو ئەهلی سوننە قسەیان کرد، بەڵام تەفسیریان کرد بە تەفسیری موعتەزیلەکان، وە وتیان : خیلافی نێوان ئێمە و موعتەزیلەکان خیلافێکی لەفظیە) .

وە لە هەمان کتێب **(٢٣٧/٧)** ئەڵێت : (ئەشعەریەکان تەفسیری بینینی اللّه تعالی یان کرد بە زیادبوونی عیلم، وە موعتەزیلەکان لەمەدا لەگەڵیان کێشەیان نییە، - واتە لە تەحریف کردنی الرؤية بە زیادبوونی عیلم - ، وە وتیان : ئێمە و موعتەزیلە لە واتا دا خیلافمان نییە - واتە لە واتای ئەو قسانەی ئەیکەن - ، بەڵکو خیلافمان لەگەڵ موجەسیمەکانە) .

موجەسیمە و موشەبیهە دوو دەستەواژەن کە ئەشعەریە جەهمیەکان و موعتەزیلەکان و هەموو لقەکانی تری جەهمیەکان بەرامبەر موسوڵمانان و سەلەف بەکاریئەهێنن .

لە کۆتاییدا أبو نصر السجزي کە ساڵی (**٤٤٤** ه) مردووە ئەڵێت :

پاشان ئەهلی سوننە تاقیکرانەوە دوای ئەمانە (واتا دوای موعتەزیلە) بە کەسانێک کە بانگەشەی ئەوەیان ئەکرد شوێنی قورئان و سوننەت کەوتوون، بەڵام زیانیان لە زیانی موعتەزیلە و غەیری موعتەزیلە زیاتر بوو، ئەوانیش بریتی بوون لە : (ابو محمد ابن کلاب و ابو العباس القلانسي و ابو الحسن الاشعري) دوای ئەوانیش : (محمد بن ابي ترید لە سجستان و ابو عبدالله ابن مجاهد لە بەصرە) لە سەردەمی ئێمەشدا : (ابو بکر ابن الباقلاني لە بغداد و ابو اسحاق الاسفراییني و ابو بکر ابن فورك لە خوراسان)، جا ئەمانە ڕەددی هەندێک ووتەی موعتەزیلە ئەدەنەوە، وە ڕەددی ئەهلی سوننە ئەدەنەوە زۆر لەوە زیاتر کە ڕەددی موعتەزیلە ئەدەنەوە.

**رسالة إلى أهل زبيد في الرد على من أنكر الحرف والصوت : ٢٢٠**

# الشاطبي الأشعري الجهمي و پەکخستن و تەحریفکردنی سیفەتەکانی الله تعالى

**١٦** - الشاطبي الأشعري الجهمي لە **(الموافقات : ٢٥٧/٢)** نەفی سیفەتی الإستهزاء و المكر و الكيد ئەكات بۆ الله عز وجل، وە ئەڵێت ئەم ئایەتانە مەجازین، واتە واتا ئەسڵیەکەی مەبەست نییە :

| ٱللَّهُ يَسۡتَهۡزِئُ بِهِمۡ وَيَمُدُّهُمۡ فِي طُغۡيَٰنِهِمۡ يَعۡمَهُونَ | (البَقَرَة : ١٥) .

| وَمَكَرُواْ وَمَكَرَ ٱللَّهُۖ وَٱللَّهُ خَيۡرُ ٱلۡمَٰكِرِينَ | (آلِ عِمرَان : ٥٤) .

| إِنَّهُمۡ يَكِيدُونَ كَيۡدٗا * وَأَكِيدُ كَيۡدٗا | (الطَّارِق : ١٥ - ١٦) .

—

: لێرەدا الشاطبي ئەڵێت ئەم ئایەتانە مەجازیە بۆ ئەوەی تەحریفیان بکات، چونکە کە ئەم ئایەتانەی خوێندووەتەوە یەکسەر تەشبیهی ئەو سیفەتانەی کە لە ئایەتەکەدا هاتووە کردووە بەو سیفەتانەی کە لە مرۆڤەکاندا هەن، هەربۆیە کەوتووەتە ناو پەکخستنەوە .

هەندێک سیفەت هەیە دوو مانای هەیە، یان دوو جۆرە، واتایەک ئەهلی سوننە جێگیری ئەکەن بۆ الله عز وجل، وە واتایەک نەفی ئەکەن، ئەم سێ سیفەتەش ئەم جەهمیە تەحریفی ئەکات لەو جۆرەیە، بۆ زیاتر تێگەیشتن تەماشای ڕوونکردنەوەی إبن بطة رحمه الله بکە بۆ سیفەتی (تعجب : سەیر پێهاتن) :

- إبن بطة رحمه الله ئەڵێت : تعجب دوو جۆرە :

**یەکێکیان** : (خۆشویستنە، ئەویش بە تەعزیم کردنی قەدری تاعەت دێت، یان توڕەبوون، ئەویش بە تەعزیم کردنی قەدری تاوان دێت) .

نموونەش لەم جۆرە فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ : (إن الله تعجب لشاب ليس له صبوة) واتا : الله سەیری بەو گەنجە دێت کە مەیلی نیە بەلای شەهەوات .

إبن بطة ئەڵێت : واتا الله خۆشی ئەوێت و ڕازییە لێی، قەدری گەورەیە لەلای الله .

**دووەمیان** : (تعجب وەکو ئینکاری کردن لە شتێک) .

الله زۆر بەرز و بڵندە لەوەی کە ئەم جۆرە تەعەجوبەی هەبێت، چونکە کەسی متعجب کە سەیری دێت لە شتێک لە جۆری ئینکاریکردن ئەوا ئەو

کەسە جاهیلە بەم شتە نایزانێت، جا کاتێک ئەیزانێت و ئەیبینێت ئینکاری لێ ئەکات و سەیری پێ دێت، الله گەورە و پاکە لەوەی بەمە وەسف بکرێت، وە فەرموودە هاتووە لە پێغەمبەر ﷺ کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی تەعەجوبی الله لە جۆری یەکەمە .

**الإبانة الكبرى**

: جا جۆری دووەم کە إبن بطة باسی کرد ئەم جۆرەیان هۆکارەکەی جەهلە، تۆ پێت وایە شتێک بە جۆرێکە دواتر بە جۆرێکی تر ئەبێت تەعەجوب ئەکەیت چونکە نەتئەزانی بەم جۆرە ئەبێت، یان شتێک چاوەڕێ ناکەیت ڕووبدات کە ڕوونەدات سەیرت پێ دێت چونکە عیلمت نەبووە کە ڕووئەدات، بەڵام الله عیلمی بە هەموو شتێک هەیە بەر لە ڕوودانی بۆیە پاکە لەوەی تەعەجوبی لە جۆری دووەم بێت، بەڵکو سەیر هاتنی ئەو واتا خۆشویستن و ڕازی بوون و تەعزیم کردنی چاکەی بەندەکانی، یان تورە بوون و ڕق لێبوونەوە و بە گەورە دانانی تاوانی بەندەکانی، هەروەک چۆن تاوانی قورەیشی بە گەورە دانا کە گاڵتە ئەکەن بە قورئان و تەعەجوبی کرد فەرمووی : (بل عجبتُ)، ئەمەش واتا تعجب دوو مانای هەیە، وە تەنها یەک دانەیان بۆ الله عز وجل جێگیر ئەکرێت، وە دانەکەی تر نەفی ئەکرێت .

- ئەگەر تەماشای سیفەتی (الإستهزاء : گاڵتە پێکردن) بکەیت بە دوو شێوەیە :

**یەکەمیان** : (گاڵتە بە کەسێک ئەکەیت بەبێ ئەوەی گاڵتەت پێ بکات)

.

**دووەمیان** : (گاڵتە بە کەسێک ئەکەیت لەبەر ئەوەی ئەیەوێت گاڵتەت پێ بکات، واتە شتەکە مقابلة یە، واتە تۆ گاڵتەت پێ نەئەکرد ئەگەر ئەو نەیویستایە گاڵتەت پێ بکات، چونکە تۆ کەسێک نیت گاڵتە بکەیت بە خەڵکی) .

ولله مثل الأعلى ئەم سیفەتەش بۆ الله عز وجل بە شێوەی دووەمیانە نەک یەکەم، تەماشای ئایەتەکان بکە تێئەگەیت :

| وَإِذَا لَقُوا الَّذِينَ آمَنُوا قَالُوا آمَنَّا وَإِذَا خَلَوْا إِلَىٰ شَيَاطِينِهِمْ قَالُوا إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِئُونَ * ٱللَّهُ يَسۡتَهۡزِئُ بِهِمۡ وَيَمُدُّهُمۡ فِي طُغۡيَٰنِهِمۡ يَعۡمَهُونَ | (البَقَرَة : ١٥ - ١٦) .

الله تعالى لێرەدا باسی مونافیقەکان ئەکات کە لەلای موسوڵمانەکانن ئەڵێن ئێمە ئیمانمان هێناوە، وە کاتێک ئەچنە لای کافرەکان ئەڵێن ئێمە لەگەڵ ئێوەداین ئەوە گاڵتەیان پێ ئەکەین بەڕاستمان نییە، پاشان الله عز

وجل ئەفەرمووێت کە ئەو گاڵتەیان پێ ئەکات نەک ئەوان گاڵتە بە موسوڵمانان و پێغەمبەر و الله تعالی بکەن .

کەواتە کاتێک هەموو باسەکەمان هێنا ڕوون بوویەوە الله عز وجل لە بەرامبەر ئەوەی موونافیقەکان گاڵتە بە موسوڵمانان و پێغەمبەر ﷺ ئەکەن، ئەو گاڵتە بە موونافیقەکان ئەکات، واتە الله عز وجل خۆی گاڵتە بە کەس ناکات، بەڵام کە کەسی بەرامبەر گاڵتەی بە پێغەمبەر ﷺ و موسوڵمانان کرد ئینجا ئەویش گاڵتەی پێ ئەکات، هەر بۆیە نابینیت هیچ زانایەکی ئەهلی سوننە بڵێت ناوی (المستهزيء : گاڵتەپێکەر) ناوێکە لە ناوەکانی الله تعالی، چونکە گاڵتە پێکردن سیفەتێکە لە سەدا سەد سیفەتی کەمال نییە، بەڵکو بەشێکی (بەشی یەکەم کە لە سەرەوە باسمان کرد) سیفەتی نوقسانە و بۆ الله عز وجل جێگیر ناکرێت، وە بەشێکی تری (بەشی دووەم کە لە سەرەوە باسمان کرد) سیفەتی کەمالە و بۆ الله عز وجل جێگیر ئەکرێت .

- ئەگەر تەماشای سیفەتی (المکر : فێڵ کردن) بکەیت بە دوو شێوازە :

**یەکەمیان** : (فێڵ لە کەسێک ئەکەیت بەبێ ئەوە ئەو فێڵت لێ بکات)

.

دووەمیان : (فێڵ لە کەسێک ئەکەیت لەبەر ئەوەی ئەو ئەیەوێت فێڵت لێ بکات، واتە تۆ کەسێک نیت فێڵ لە خەڵکی بکەیت، بەڵام لە بەرامبەر ئەوەی ئەو ئەیەوێت فێڵت لێ بکات تۆ نایەڵیت فێڵت لێ بکات بەڵکو تۆ فێڵی لێ ئەکەیت) .

ولله مثل الأعلى ئەم سیفەتەش بۆ الله عز وجل بە شێوەی دووەمیانە نەک یەکەم، تەماشای ئایەتەکان بکە تێئەگەیت :

| وَمَكَرُواْ وَمَكَرَ ٱللَّهُۖ وَٱللَّهُ خَيْرُ ٱلْمَٰكِرِينَ | (آلِ عِمرَان : ٥٤) .

: ئەم ئایەتە باسی ئەوە ئەکات کە یەهوودیەکان ویستیان فێڵ لە پێغەمبەر عیسی ﷺ بکەن بەوەی کە بیکوژن، بەڵام لە بەرامبەردا الله عز وجل فێڵی لێ کردن بەوەی کەسێکی تری لە هاوەڵانی خۆیان خستە سەر شێوەی پێغەمبەر عیسی ﷺ و یەهوودیەکانیش ئەو کەسەیان کوشت نەک پێغەمبەر عیسی ﷺ .

کەواتە ڕوون بوویەوە سیفەتی (المکر : فێڵکردن) سیفەتێک نییە بە شێوەیەکی ڕەها بدرێتە پاڵ الله عز وجل، بەڵکو ئەو بەشەی ئەدرێتە پاڵ الله عز وجل کە بەشی کەمالی سیفەتەکەیە (بەشی دووەم)، وە بەشە نوقسانیەکەی نەفی ئەکرێت بۆ الله عز وجل (بەشی یەکەم کە لە سەرەوە

باسکراوە)، هەربۆیە نابینیت هیچ زانایەکی ئەهلی سوننە بڵێت (الماكر) یەکێکە لە ناوەکانی الله تعالی .

- ئەگەر تەماشای سیفەتی (الكيد : پیلان دانان) بکەیت دوو جۆرە :

یەکەمیان : (پیلان بۆ کەسێک دائەنێیت بەبێ ئەوەی پیلانی بۆ دانابیت) .

دووەمیان : (پیلان بۆ کەسێک دائەنێیت لەبەرامبەر ئەوەی ئەو پیلان بۆ تۆ دائەنێت) .

ولله مثل الأعلى ئەم سیفەتەش بۆ الله عز وجل بە شێوەی دووەمیانە نەک یەکەم، تەماشای ئایەتەکان بکە تێئەگەیت :

| إِنَّهُمْ يَكِيدُونَ كَيْدًا * وَأَكِيدُ كَيْدًا | (الطَّارِق : ١٥ - ١٦) .

: الله عز وجل لێرەدا باسی کافرەکان ئەکات کە پیلان دائەنێین بەرامبەر دینی الله بۆ ئەوەی سەرکەون بەسەریدا، وە الله تعالی ش لە بەرامبەردا پیلانیان بۆ دائەنێت .

لە کۆتاییدا : سیفەتی (الإستهزاء، المكر، الكيد) سێ سیفەتن کە دوو جۆر یان دوو واتایان هەیە، جۆرێکیان بۆ الله تعالی جێگیر ئەکرێت، وە

جۆرێکی دیکەیان بۆ الله عز وجل جێگیر ناکرێت لەلای سەلەف، والله أعلم
.

# الشاطبي الأشعري الجهمي و پەکخستن و تەحریفکردنی سیفەتەکانی الله تعالی

**١٧** - الشاطبي الأشعري الجهمي لە **(الموافقات : ١٩٤/٢)** نەفی سیفەتی الحب والبغض (خۆشویستن و ڕقلێبوون) ئەکات بۆ الله تعالی بەوەی کە ئەڵێت : (ئەو واتا حەقیقیەی حب و بغض هەیەتی لە زمانی عەرەبیدا **مەحاڵە** بۆ الله تعالی) .

بزانە رحمک الله ئەو عەقیدە کەلامیە کوفریەی ئەشعەریە جەهمیەکان هەیانە وایان لێ ئەکات بەرامبەر چەندین سیفات ی الله عز وجل بڵێن (مەحاڵە الله ئەو سیفەتەی هەبێت)، چونکە جێگیرکردنی سیفەتەکە لەسەر ڕووکەشەکەی کە (لەڕاستیدا عەقیدەی موسوڵمانانە و تەوحیدە) ئەوان بە کوفر و تەشبیهی ئەزانن و بەرامبەری لەسەر تەکفیر ئەکەن .

**١٨** - الشاطبي الأشعري الجهمي لە **(الموافقات : ١٦٤/٢)** نەفی سیفەتی الدنو (نزیکبوونەوە) ئەکات بۆ الله تعالی بەوەی کە ئەڵێت : (الله پاکڕاگیراوە لەوەی نزیک ببێتەوە لە بەندەکانی) .

بە خیلافی ئەوەی ئەشعەریە جەهمیەکان ئەیڵێن الله تعالى هەموو شەوێک سێیەکی شەو دێتە ئاسمانی دنیا و لە بەندەکەی نزیک ئەبێتەوە، وە لە ڕۆژی قیامەتدا دێت و لە بەندەکەی نزیک ئەبێتەوە وەک چۆن ئەفەرموویت : | وَجَاءَ رَبُّكَ وَالْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا | (الفجر : ٢٢) .

وە رسول الله ﷺ ئەفەرموویت : (بەندە نزیک ئەبێتەوە لە پەروەدگاری هەتا ستر و داپۆشەری خۆی ئەخاتە سەری و دانی پێ ئەنێت بە تاوانەکانیدا ...) صحیح البخاري .

هۆکاری پەکخستنی ئەم سیفەتە لەلایەن جەهمیەکانەوە لەبەر ئەوەیە پێیان وایە الله لە هیچ شوێنێک نییە هەتا لە بەندە نزیک ببێتەوە یان بەندە لێی نزیک ببێتەوە .

**١٩** - الشاطبي الأشعري الجهمي لە **(الإعتصام : ٣٠٥/١)** تەحریفی سیفەتی وجه و يد و رجل و عين و جهه (ڕوو و دەست و پێ و چاو و شوێن) ئەکات بۆ الله تعالى، باسی ئەوە ئەکات لەو سیفەتانەی تەئویل (تەحریف) ئەکرێن ئەمانەن، دواتر ناوی ئەو سیفەتانە ئەهێنێت کە لە سەرەوە باس کراوە .

بزانە رحمک الله جەهمیەکان کە ئەم سیفەتانە پەکئەخەن هیچ عوزرێکیان نییە، وە هیچ ئایەتێک یان فەرموودەیەک نەبووە بە شوبهە و

گومان بۆیان، بەڵکو گشت ئایەت و فەرموودەکان دژی عەقیدەی کوفریەکەیانە، وە بگرە زۆر باشتر لە من و تۆ لە ئایەتەکان تێ ئەگەن و ئەزانن مەبەستی ئایەتەکە چییە بۆیە ڕەتی ئەکەنەوە، هۆکاری ڕەتکردنەوەی ئایەت و فەرموودەکانیش لەلایەن ئەشعەریەکانەوە ئەگەڕێتەوە بۆ نەگونجانی ڕووکەشی ئایەت و فەرموودەکان لەگەڵ ئەو قاعیدە کەلامیە کوفریانەی کە لە مێشکە پووچەکەیاندا چەسپاوە، ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە بەرگری لە عەقیدەی رسول اللە ﷺ و هاوەڵانی رسول اللە رضي اللە عنهم و سەلەف و تەواو موسوڵمانان بکەیت؟ کاتی هەوە نەهاتووە هەڵوێستت هەبێت بەرامبەر ئەوانەی کە سیفەتەکانی اللە تعالی پەکئەخەن، وە تەحاکومیان بردووەتەوە بۆ عەقیدەی ئەرستۆ و ئەفلاتوون و کافرانی تر، وە ئەبێت اللە بەگوێرەی ئەو قاعیدە کوفریانەی ئەوان بێت نەوەک بەو شێوەیەی وەسفی خۆی کردووە لە قورئان و فەرموودەدا؟

## الشاطبي الأشعري الجهمي و عەقیدەی جەهمیەکان لە بابەتی ئیمان ــدا

- إبن تیمیة ئەڵێت : وە ابو الحسن الأشعري قسەکەی جەهمی سەرخست لە بابەتی ئیمان دا، وە قسەکەی جەهم وتەیەکە هیچ کەس لە پێشەوایانی ئەهلی سوننە نەیان وتووە، بەڵکو احمد بن حنبل و وکیع و أبو عبید القاسم بن سلام و جگە لەوانیش تەکفیری ئەو کەسەیان کردووە کە قسەکەی جەهمی کردووە کە ابو الحسن یش ئەوەی سەر خستووە، وە لای ئەوان ئەم وتەیە خراپترە لە وتەی مورجیئەکان .

**(مجموع فتاوی - ٧ /١٢٠)**

بزانە رحمک الله عەقیدەی سەلەف لە بابەتی ئیماندا ئەوەیە کە : (ئیمان = قول و عمل، یان قول و عمل و نیة، یان قول و عمل و نیة و إصابة السنة) یە، ئەم سێ پێناسەیە دەلالەتە لە یەک مەبەست بەڵام بە سێ شێوازی جیاواز، مەبەستەکەش ئەوەیە کە (ئیمان واتە کار و کردەوە و بەڕاستدانانی دڵ بۆ ئەو شتانەی کە مرۆڤی موسوڵمان پێویستە باوەڕی پێی هەبێت، وە وتنی شەهادە بە زوبان، وە ئەنجامدانی ئەو کار و کردەوەیانەی

شەرع فەرمانی پێ کردووە، وە لە هەموو ئەمانەدا نیەتت تەنها و تەنها بۆ الله بێت، وە لەسەر سوننەتی رسول الله ﷺ ئەم کارانە ئەنجام بدەیت) .

وە عەقیدەی مورجیئە گومڕا بیدعەچیەکان ئەوەیە کە ئیمان تەنها قول ە، واتە بەڕاستدانانی دڵ و وتنی بە زمان، مورجیئەکان عمل لە ئیمان ئەکەنە دەرەوە، واتە شەرتی دروستێتی ئیمانی نازانن تەنها بە شەرتی کەمال ی ئەزانن، لەبەر ئەمە سەلەف رحمهم الله بە توندترین شێوە ڕووبەڕوویان وەستاونەتەوە و تەبدیعیان کردووە .

عەقیدەی جەهمیە کافرەکانیش ئەوەیە کە ئیمان تەنها بەڕاستدانان یان ناسینی دڵە، واتە ئەگەر کەسێکی (بەناو) موسوڵمان جلی جولەکەکان لەبەر بکات و نوێژی جولەکەکان بکات ئەوە نابێت پێی بڵێیت کافر پێش ئەوە بزانیت لە دڵەوە ئەو شتە ئەکات یان نا، یان ئەگەر کەسێک بە پێیەکانی (والعياذ بالله) بڕواتە سەر قورئان و جوێنی پێ بدات کافر نییە ئەگەر ئەم کارەی لە دڵەوە نەکردبێت، ئەمە عەقیدەی جهم بن صفوان و بشر المريسي و أبو حسن الأشعري یە لعنهم الله لعنة واسعة، إبن تيمية چەند جارێک ئاماژەی بەو بابەتە کردووە .

**٢٠** - الشاطبي الأشعري الجهمي لە **الموافقات (٨٤/١)** ئەڵێت (ئیمان کردەوەیەک لە کاروکردەوەکانی دڵ، وە بریتیە لە التصديق) .

جەهمیەکان ئەڵێن ئیمان بریتیە لە التصديق، یان ئەڵێن بریتیە لە المعرفة یان الإقرار، لەم سێ ئەم وشەیە هەمان مەبەستیان هەیە .

خودی أبو حسن الأشعري لە بابەتی ئیماندا عەقیدەی جەهمیەکانی هەیە، بەڵام هەندێک لە ئەشعەریەکان لە ڕووکەشی قسەکانیاندا وا دیارە لە ئیماندا عەقیدەی مورجیئەکانیان هەیە نەوەک جەهمیەکان، بەڵام هەردووکیان لە بابەتی ئەسماء و سیفات و قەدەردا ئەشعەریەکان جەهمیەکانیان خەجاڵەت کردووە لە زەندیق بووندا .

# پوختەی عەقیدەی ئەشعەریە جەهمیە جەبریە پەکخەرەکان لە بابەتی قەدەردا

- نەفیکردنی تحسین و تقبیح (بەباش دانان و بەخراپ دانان) عەقڵی گومڕاییەکی ترە کە ئەشعەریە جەهمیەکان بەهۆی عەقیدەی جەبریانەوە لە بابەتی قەدەردا کەوتوونەتە ناویەوە .

مەبەست لە بەباش دانان یان بەخراپ دانانی عەقڵی ئەوەیە کە ئینسان هەتا سنوورێکی دیاریکراو ئەتوانێت شتی خراپ و باش لەیەک جیابکاتەوە پێش هاتنی قورئان و فەرموودە، واتە ئینسان پێش هاتنی شەرع یش ئەزانێت دزین کارێکی خراپە، وە ئەزانێت زینا شتێکی خراپە، وە ئەزانێت دادپەروەری باشە و زوڵم کردن خراپە بەهۆی ئەو فیترەتەی الله تعالی لەسەری دروستی کردووە، وە مرۆڤ ناتوانێت هەموو ڕاست و خراپیەک لەیەک جیا بکاتەوە پێش هاتنی قورئان و فەرموودە، هەربۆیە الله عز وجل پێغەمبەر و کتێبی ناردووە بۆ خەڵکی، هەتا بەتەواوی بۆیان ڕوون ببێتەوە کە چ شتێک خراپە و چ شتێک باشە .

بەڵام لەلای ئەشعەریە جەهمیە جەبریەکان نەفی بەباش دانان و بەخراپ دانانی عەقڵی ئەکەن، واتە ئەڵێن مرۆڤ ناتوانێت هیچ ڕاست یان هەڵەیەک لەیەک جیا بکاتەوە پێش هاتنی شەرع، لەکاتێکدا ئەم شتە زۆر سەرەتاییە و هەموو کەس ئەگەر شەرع یشی بۆ نەیەت ئەزانێت هەندێک کار خراپە و هەندێکی تر چاکە، بەڵام ناتوانێت خراپی و چاکی هەموو کارەکان بزانێت .

- ئەشعەریە جەهمیەکان لە عەقیدەدا جەبرین، وشەی جەبر واتە بەزۆر ئەنجامدانی کارێک بە کەسێک ئەگەر خۆی ویستی ئەنجامدانی هەبێت یان نا، ئەشعەریەکان پێیان وایە هەموو کار و کردەوەکان الله تعالى بەزۆر ئەیکات بە مرۆڤەکان، لە عەقیدەی ئەواندا کەسێک زینا ئەکات الله (والعیاذ بالله) بەزۆر پێی ئەکات، وە کاتێک نوێژ ئەکات بەزۆر پێی ئەکات، چونکە پێیان وایە مرۆڤ ویستی نییە و تەنها الله تعالى ویستی هەیە، بەڵام الله عز وجل لە قورئانەکەیدا زۆر بە ڕوونی وەڵامیان ئەداتەوە و ئاماژە بەوە ئەدات مرۆڤیش ویستی هەیە :

| وَمَا تَشَاءُونَ إِلَّا أَنْ يَشَاءَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ | (التكوير : ٢٩) .

واتە ئەگەر تۆ بتەوێت کارێک ئەنجام بدەیت، جا ئەم کارە باش بێت یان خراپ ئەوە تۆ ناتوانیت کارەکە ئەنجام بدەیت هەتا الله تعالی ویستی لێ نەبێت .

تۆ هەرچی بکەیت لەژێر ویست و قەدەری الله تعالی دەرناچیت، بۆ نمونە تۆ لەژێر ئاسماندایت، هەر شتێک بکەیت هەر لەژێر ئاسماندایت ناتوانیت لەژێر ئاسمان دەربچیت، وە تۆ ویستت هەیە، بەڵام ئەگەر تۆ ویستت شتێک بکەیت ئەگەر الله تعالی ویستی لێ هەبێت ئەتوانیت بیکەیت، گەر ویستی لێ نەبێت ئەگەر هەموو هۆکارەکانیشیت هەبێت ئەوە ناتوانیت ئەو کارە ئەنجام بدەیت .

هەربۆیە لە عەقیدەی ئەهلی سوننە و جەماعە (سەلەف) مرۆڤیش ویستی هەیە، بەڵام ویستی مرۆڤ لەژێر ویستی الله تعالی دەرناچێت و ویستی الله عز وجل بەسەریدا زاڵە .

بەڵام لەلای ئەشعەریە جەهمیە جەبریەکان مرۆڤ هیچ ویستێکی نییە، وە هەموو شتەکانی لەلایەن الله تعالی وە بەزۆر پێ ئەکرێت ئەگەر مرۆڤەکە پێی ویستی لێی بێت یان نا .

لە عەقیدەی ئەهلی سوننە مرۆڤ هەر شتێک ئەیکات بە ویستی خۆیەتی بەڵام لە ئەنجامدا ئەگات بەو قەدەرەی الله عز وجل بۆی داناوە، بۆ

نمونه به سەیارە خاو بڕۆیت و پێکدادان نەکەیت قەدەری الله تعالی یە وە لەسەرتی نووسیوە، وە بە خێراییش بڕۆیت و پێکدادان بکەیت هەر قەدەری الله یە وە لەسەرتی نووسیوە، بەڵام نابێت خێرا بڕۆیت چونکە الله نووسیووە تعالی عەقڵی پێداویت خۆت ئەزانیت خراپە، وە لە هەمانکاتیشدا خۆت ویستت هەیە، ئەتوانیت خاو بڕۆیت، وە ئەتوانیت خێرا بڕۆیت، وە بگەیت بە هەر شتێک قەدەری الله تعالی یە، وە قەدەرەکەش لە تۆ شاراوەیە، بگەیت بە هەر ئەنجامێکیش الله تعالی لەسەری نووسیویت .

- لەلای ئەشعەریە جەهمیە جەبریەکان تەوحید بریتیە لە (لا فاعل إلا الله)، واتە پێیان وایە بکەری هەموو کارێک الله یە، پێیان وایە ئەوە چەقۆ نییە ئەبڕێت بەڵکو الله یە کە ئەبڕیت، پێیان وایە الله بکەری شتەکانە نەک مرۆڤ، وە ئەم عەقیدەیە زۆر فاسید و خراپ و بۆگەنە، وە بگرە لە عەقیدەی قەدەریەکان زۆر خراپترە، بۆ ئەوەی خراپی عەقیدەکەت بۆ دەربکەوێت نمونەی کەسێکی زیناکەر جێبەجێ بکە لەسەر نمونەی چەقۆکە، شتەکە هێندە پیسە ناتوانم باسی بکەم .

ئەم گومڕاییەیان لە دژی قەدەریەکان تووش بووە، وەکچۆن عەقیدەی ئیرجاء لەدوای خروج کردنی إبن الأشعث دروستبوو بە هەمان شێوەش

عەقیدەی جەبریەکان لە ئەنجامی پێچەوانەکردنی عەقیدەی قەدەریەکان تووشیان بوو .

لەلای بەشێک قەدەریەکان مرۆڤ خۆی کار و کردەوەی خۆی دروست ئەکات و ئەنجامدەریەتی، وە ویستی مرۆڤ بەسەر ویستی الله دا زاڵە، وە ئەکرێت الله شتێکی بوویت بەڵام مرۆڤەکە نەیەوێت لە ئەنجامدا ویستی مرۆڤەکە سەر بکەوێت بەسەر ویستی الله (والعیاذ بالله) .

لەلای جەبریەکان الله کار و کردەوەی مرۆڤ دروست ئەکات و هەر الله خۆی ئەنجامدەریەتی و بەزۆر کار بە مرۆڤەکان ئەکات و بگرە مرۆڤەکان ویستیان نییە .

لەلای سەلەف الله تعالی کار و کردەوەی بەندەکان دروست ئەکات بە باش و خراپییەوە، وە خودی بەندە خۆی ئەنجامدەری کارەکەیە، وە مرۆڤیش ویستی هەیە بەڵام ویستی الله تعالی بەسەر مرۆڤدا زاڵە، ئەبێت الله تعالی یەکەمجار ویستی لەسەر شتەکە هەبێت ئینجا مرۆڤیش ئەتوانێت ویستی لەسەری هەبێت و ئەنجامی بدات، وە هەر شتێک تووشی مرۆڤ ببێت لە چاکە یان خراپە الله تعالی لەسەری نووسیوە .

- لەلای ئەشعەریە جەهمیەکان خودی شتەکان بە باش یان خراپ وەسف ناکرێن الله تعالی بە باش یان بە خراپ وەسفیان نەکات، واتە

ناتوانیت بڵێیت تەوحید چاکە یان خراپە هەتا الله تعالى فەرمان بە تەوحید و نەهی لە شیرک نەکات، بەڵام لەلای ئەهلی سوننە شتەکان ئەکرێت بە باش یان بە خراپ وەسف بکرێن، وە الله بەهۆی ئەو باشیەی لە شتە باشەکەدایە فەرمان بە شتە باشەکە ئەکات، وە بەهۆی ئەو خراپییەی لە شتە خراپەکەیدایە نەهی لە خراپەکە ئەکات، بۆ نمونە ئەفەرمووێت: ﴿ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَ ﴾ (الأعراف : ١٥٧)، واتە شتە باش و پاکەکانیان بۆ حەڵاڵ ئەکات و شتە پیسەکانیان لێ حەرام ئەکات، لێرەدا الله تعالى لەبەر پاکیی شتە پاکەکان حەڵاڵی کردوون، وە لەبەر پیسی شتە پیسەکان حەرامی کردوون، هۆکاری ئەم قسەیەشیان ئەوەیە کە نەفی سیفەتی حیکمەت ی الله تعالى ئەکەن .

- ئەشعەریە جەهمیە جەبریەکان نەفی سیفەتی حیکمەتی الله عز وجل ئەکەن، واتە پێیان وایە الله عز وجل لەبەر حیکمەتێک یان لەبەر هۆکارێک کارێک ناکات، بۆ نمونە لای ئەشعەریەکان ئەکرێت الله تعالى رۆژی قیامەت هەموو خەڵکی بخاتە جەهەننەمەوە، چونکە پێیان وایە کارەکانی الله عز وجل لەبەر حیکمەتێک نین، بەڵام لەلای ئەهلی سوننە و جەماعە (سەلەف) کارەکانی الله تعالى هەمووی لەبەر حیکمەتێکە، وە ئەکرێت ئێمە ئاگادار کرابینەوە لەو حیکمەتە یان ئاگادار نەکرابێتینەوە، وە الله تعالى ئیمانداران

ئەخاتە بەهەشتەوە و کافران ئەخاتە جەهەننەمەوە، چونکە حیکمەت لە هەموو کارەکانیدا هەیە .

**٢١** - الشاطبي الأشعري الجهمي الجبري لە بابەتی قەدەردا هەمان عەقیدەی ئەشعەریە زەندیقەکانی هەیە، لە **الموافقات (٤/١)** ئەڵێت : (هەتا زۆرلێکردنێکی بێخەوش و ڕوون دەرکەوت لەسەر قەدەرەکان)، وە ئەڵێت : (وە لە کردەوەکاندا حوکمی ناچاری جێگیربوو)، ئەم دوو قسەیەی الشاطبي مەزهەبی ئەشعەریەکانە، پێیان وایە ئەو کار و کردەوەیەی مرۆڤەکان ئەیکەن بەزۆر ناچار کراون ئەنجامی بدەن .

**٢٢** - لە **الإعتصام (١٤٧/١)** لەبارەی تحسين و تقبيح ی عەقڵی ئەڵێت : (لەلای زانایانی الکلام لە بیدعە ئاشکراکانە) .

**٢٣** - لە **الإعتصام (١٩١/١)** ئەڵێت : (زۆربەی بیدعەچییەکان دانئەنێن بە تحسين و تقبيع ی عەقڵی) .

**٢٤** - لە **الإعتصام (٢٢١/١)** دەربارەی تحسين و تقبيح ی عەقڵی ئەڵێت : (لە گەورەترینی تاوانەکان و لادانە ڕوونەکان و دەرچوونە لە سوننەتە) .

لەلای ئەشعەریەکان جەهمیەت سوننەتە، وە عەقیدەی سەلەفیش بیدعە و گومڕایی و کوفر و تەشبیهـ و تەجسیمە .

لەم شوێنانەی تریشدا **الإعتصام (١/١٣٦)**، **الإعتصام (١/٤٨٧)**، **الإعتصام (٢/٥٣٢)**، **الإعتصام (٢/٥٩٤)**، **الإعتصام (٢/٨٧٢)** هەمان ئەو قسانە ئەکات کە لە سەرەوە هێنامان .

لە **الموافقات (١/١٢٥)** ئەڵێت : (ئەوە ڕوون بووەتەوە لە عیلمی کەلامدا کە عەقڵ تحسین و تقبیح ناکات) .

هەر ئەو کەلامەی کە ئەم ئەشعەریە جەهمیانە عەقیدەی خۆیانی لەسەر بنیادناوە لەلایەن سەلەفەوە بە ناشرینترین شێوە زەم کراوە، وە فەرموویانە ئەوەی ئەهلی کەلام بێت بەرەو زەندەقە و کوفر ئەڕوات، بێگومان سەلەف بەرچاوڕۆشن بوون لە دینەکەیاندا، هەر بەناو عیلمی کەلام بوو کە ئەهلەکەی تووشی کوفر و زەندەقە کرد لە بابەتی ئەسماء و سیفات و قەدەر و ئیمان و النبوات و . . . هتد، ئەم قسەیەی الشاطبي یش ئەوە دەرئەخات کە عەقیدەی خۆی لەسەر بەناو عیلمی کەلام بنیادناوە .

لە چەند شوێنێکی تر کتێبەکانیدا ئاماژە بە عەقیدەی جەبریەت و نەفی تحسین و تقبیح ی عەقلی ئەکات بەڵام ئەوەندەی هێناومانە إن شاء الله کافیە .

نزیکەی چوار گومڕایی دیکەی هەیە تەنها لە بابەتی قەدەردا، وە لە بابەتی النبوات و المیزان و چەندین بیدعەی سۆفیەکاندا تووشی گومڕایی بووە لەگەڵ چەند بابەتێکی دیکەدا .

لینکی کەناڵ :

https://t.me/imamakany_kufr